# زمانی HTML دینامیکی

ئەندازیار
هەلمەت غریب

kurdsite@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# زمانی HTML

## چەند وانەیەك لەسەر HTML

نووسینی: مهندس هەڵمەت غریب خضر 2005/2/26

**وشەی ئێچ تی ئێم ئێل HTML کـورتکراوەی Hyper Text Markup Language یـان زمانی نیشان کراوی تشعبی ....ئەم زمانە بریتیە لە زمانی بەکارهاتوو بۆ دروست کردنـی هـەموو ماڵپەرە جوان و بێ وێنەکانی وێب, بۆیە ئەگەر ئەتەوێت سایتێکی وا دروست کەیت فـەرموو ئـەم پەرتووکە بخوێنەوەوە:**

# پێشەکی

فایلەکانی HTML لەشێوەی فایلی نووسینی سادەن ( Plain Text), کە پاشگری html هەڵئەگرن, ئەم فایلانە ئەتوانرێن بنووسرێن لەهەر بەرنامەیەکی سادەی نووسین ...لەویندۆز ...تۆ ئەتوانیت بەرنامەی Notepad لە لینیکس بەبەکارهێنانی بەرنامەی pico لە ماکنتۆش بەبەکارهێنانی Simple Text, هەموو ئەم بەرنامانە گونجاون بۆ دروست کردنی لاپەرەی HTML.

شتێکی تریش پێویستە بۆ ئەم کارە ....ئەویش یان Internet Explorer یانیش Netscape Navigator یان هەردووکیان بەیەکەوە, چونکە پێویستت بە سەیر کردنی لاپەرەکە ئەبێت دوای نووسینیان, لەبەر ئەوەی ئەم بەرنامانەی سەرەوە هەریەکەیان بەشێوەیەك لاپەرەکە نیشان ئەدەن بۆیە واباشە تۆ کاتی دروست کردنی ماڵپەرەکە بەهەریەکەیان تاقی بکەیتەوە ...چونکە خەڵکان هەریەکە جۆرە متصفحێك بەکارئەهێنن بۆ چوونە ژوورەوە لەئەنتەرنێت ...

هەرچەندە ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر باشترینیانە چونکە پالپشتی نووسینەکانی کوردی و عەرەبیش ئەکات ...جگە لە دوا پێشکەوتنی HTML 4.0, XML, CSS ...کەچی نیت سکەیپ ناڤیگەیتەر وانیە بەشێوەیەکی باش پالپشت نیە بۆ زمانی کوردی و عەرەبی .... بۆیە ئێکسپلۆرەر بەباشترینیان دائەنرێت.

# روونکردنەوە

**دوا ڤێرژنی متصفحی Netscape Navigator بریتیەلە ڤێرژنی 4.72 وە دوا ڤێرژنی بەرنامەی Sindbad ...4.51 ...بەم دواییە کۆمپانیای صخر راوەستا لە تعریب کردنی متصفحی ناڤیگەیتەر**

دوای هەموو ئەوانەی سەرەوە..... زمانی HTML زمانێکی دەربرینی زۆر ئاسانە ...لەهەمان کاتدا بەهێزە لەتوانایداو ...خاسیەتەکانی زۆر نایابن.... هەموو ماڵپەرەکانی جیهانی کاتێك سەردانیان ئەکەیت ..بەپێشکەوتوویی دێنە بەرچاوتەوە بەم زمانە دروست کراون ....هەروەها ئەم زمانە بەوە ناسراوە کە لەرێزماندا زۆر ئاسان و ناسراون, هەروەها لەم زمانەدا ئەتوانیت هەمان کار بەچەند شێوەیەك ئەنجامی دەیت... بەهەر شێوەیەك بیر بکەیتەوە ...زۆر کات هەمان ئامانج دەپێکێت.

فایلەکانی HTML لە دوو بەش پێك هاتوون:

*ناوەرۆك: بریتیە لەو بەشەی کەسەیرکەرانی ماڵپەرەکەت ئەیبینن.

*تاگەکان: بریتیە لەو بەشەی کە دەستنیشانی چۆنیتەی دەرچوونی ماڵپەرەکەتە بۆ سەیرکەرانی ماڵپەرەکەت...چونکە دەستنیشانی شێوەو ساکاری ماڵپەرەکەت ئەکات.

بۆ نموونە سەیری ئەم رستەیە بکە لە زمانی HTML :

```
HTML is a <b>Great</b> Language
```

دوای بەکارهێنانی متصفح بۆ سەیر کردنی ئەم رستەیە بەم شێوەیە دەردەچێت:

HTML is a **Great** Language

لە نموونەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت بەشەکانی فایلی HTML , ناوەرۆکەکە پێك هاتووە لە HTML is a Great Language ..تاگەکان دەورەدراون بە نیشانەی <> لە نموونەی سەرەوە تاگی bمان بەکارهێنا کە کورتکراوەی ووشەی bold (پان), لەشێوەی جووتێك تاگ دێت ...تاگێکی سەرەتا بۆ کردنەوە, تاگی کۆتایی بۆ داخستن ...بەلام جیاوازیەکەیان لەوەدایە کە تاگی کوتایی نیشانەی (/) لەگەل دەبێت پێش نووسینی ناوی تاگەکە. تاگی کردنەوە مانای وادەگەیەنێت

کە ئێکسپلۆرەر سیفەتی تاگەکە بەسەر هەموو ئەو نووسینانە جێ بەجێ بکات کە دەکەوێتە دوای تاگی سەرەتا ...تا دەگاتە تاگی کۆتایی ..وەکو پێکردن و کوژاندنەوە..تاگی کردنەوە سیفەتی پانی ئەداتە ئەو نووسینانەی کە لەدوای دێت ...تاگی داخستن ئەم سیفەتە ئەکوژێنیتەوە, هەروەکو چۆن تاگێك هەیە بۆ پان کردنی نووسینەکان ..تاگێکیش هەیە بۆ لار کردنی نووسینەکە...تاگێك بۆ گۆرینی جۆری فۆنتەکە...تاگێك بۆ گۆرینی رەنگی نووسیتەکە...تاگێك بۆ دروست کردنی جدول ....هەموو ئەندامەکانی HTML بەهۆی تاگەکانەوە جێ بەجێ ئەکرێن و سیفەتەکەیان دیار ئەکرێت

| تاگی کۆتایی | تاگی سەرەتا |
|---|---|
| </HTML> | <HTML> |
| </HEAD> | <HEAD> |
| </TITLE> | <TITLE> |
| </BODY> | <BODY> |

بۆ نموونە ئەگەر ویستت فۆنتەکە بگۆریت لە وشەی Great لە نموونەی سەرەوەدا, پێویستمان بە بەکارهێنانی تاگی فۆنت Font ئەبێت, بۆ نموونە رەنگی وشەی Great لەووشەکەی سەرەوە ئەگۆرین بۆ سوور ... بەم شێوەیە:

```
HTML is a
<font color="red">Great</font> Language
```

بەم شێوەیەی لێ دێت:

HTML is a Great Language

لە نموونەی سەرەوە شتێکی ترمان بۆ روون ئەبێتەوە, ئەویش بۆ ئەوەی سیفەتی یەك لە تاگەکان رێك بخەین پێویستە ناوی سیفەتەکە لە پێش ناوی تاگەکە دابنێین لەنێوان نیشانەی <> وە ناوی تاگەکەو سیفەتەکەی جیابکەینەوە بە یەك بۆشایی, سیفەتەکەش بەم شێوەیە دەبێت ...ناوی سیفەتەکە ئینجا نیشانەی یەکسان = ئینجا نرخی سیفەتەکە لەناو قەوسی جووتەك....لەنموونەی سەرەوە نرخی سیفەتی Color لە تاگی Font کردوومانە بە Red, ئەگەر بێت زیاتر لەیەك

سیفەتمان ویست بەکاربهێنین ئەتوانین لەهەمان شوێن بەکاریبهێنین, بەجۆرێك هەر سیفەتێك بە بۆشایەك لێكیان جیا دەكەینەوە....بۆ نموونە:

```
HTML is a <font
color="red" size="+1">Great</font> Language
```

بەم شێوەیە دەردەكەوێت:

HTML is a Great Language

چەند شتێك پێویستە بیزانیت دەربارەی HTML:




*زمانی HTML گرنگ ناداتە حالەتی پیتەكان لە گەورەو بچووكی, واتە لەزمانی HTML هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان <b> و <B>

*دەتوانیت نرخی سیفەتەكان دەورە بدەیت بە نیشانەی (") جوتەك یان (') تاك...هەروەها دەتوانیت دەورە بەهیچیان نەدەیت ئەگەر بێت و نرخەكە تەنها لەیەك ووشە پێك هاتبێت بەبێ بۆشایی.

*هەندێك لەتاگەكان پێویستیان بە تاگی داخستن دەبێت هەندێكی تر نا.




*لەوانەیە تاگی سەرەتا ئەم هەموو سیفەتانەی تێدا نەبێت بەلام بەهیچ شێوەیەك تاگی كۆتایی ئەم سیفەتانەی نابێت

*زمانی HTML گوێ بە بۆشایی نادات, بەلكو هەر چەند لەم بۆشاییانە بكەیت هەموویان بەیەك حساب ئەكات .

*دەتوانیت روونکردنەوە لەنێوان <!-- و --> دابنێیت, واتە متصفحەکەت هەموو شتێك اهمال ئەکات کە لەنێوانیان دابنرێت .

## پێك هێنەرەکانی فایلی HTML

فایلەکانی ستاندەری HTML لەدووبەشی سەرەکی پێك هاتووە:




*سەر Head: پێك هاتووە لە زانیاری زیادەی تایبەت بە فایلەکە وەکو ئەدرێسی لاپەرەکەو ووشەی پێشوازی و ...زۆر شتی تریش کە بە ناوەرۆك دانانرێت.

*لەش Body: پێك هێنەری سەرەکی مالپەرەکەیە کە سەیرکەرانی مالپەرەکەت ئەیبینن.

نموونەی خوارەوە چۆنیتی دابەش بوونی فایلەکانی HTML روون ئەکاتەوە:

```
<html>

    <head>

        ...

    </head>

```

```
    <body>

        ...

    </body>

</html>

```

نموونەكەی سەرەوە زۆر روونە پێویستی بەهیچی تر نیە, بەشەكانی سەر بە بەشی سەر لەنێوان <head> ......</head> دائەنرێن, بەلام ئەوبەشانەی سەر بە بەشی لەشن لەنێوان <body> .....</body> دائەنرێن..

دەتوانیت دەست نیشانی ئەو ئەدرێسەی دەردەچێت لەسەرووی مالپەرەكە لەسەر شەریتی ئەدریس ...بەدانانی لەنێوان تاگی <title> .......</title> ..كە شوێنی راستەقینەكەی بەشی سەرە...چونكە تاگی title بەناوەرۆكی مالپەرەكە دانانرێت وە لەمالپەرەكەش دەرناچێت , بەلكو بەكاردێت بۆ كرداری گەران و ئەرشیف كردن لە سێرچ ئینگینەكان, بۆیە ناتوانیت تاگەكانی جوانكاری لەنێو تاگەكانی title دانێیت.

چەند جۆرێكی تری تاگ هەن بۆ دەستنیشان كردنی سیفەتی فایلەكە وەكو تاگی meta كە لە بەشی سەر دائەنرێن ...دوایی زیاتر باسیان لێوە دەكەین:

بەلام تاگەكانی تر زۆربەیان لە بەشی لەش body دائەنرێت.

# فۆنتەکان و ڕەنگەکان

## ستایلە سەرەکیەکان

یەکەم: ئەدرێسەکان...لەشەش لیڤل پێك هاتوون...ئەدرێسی یەکەم h1 وئەدرێسی دووەم h2 ...هتد تا h6

```
<h1>Heading 1</h1>

<h2>Heading 2</h2>

<h3>Heading 3</h3>

<h4>Heading 4</h4>

<h5>Heading 5</h5>

<h6>Heading 6</h6>
```




بۆ دەستنیشان کردنی پاراگراف(فقرەکان) لەنێوان تاگی p دائەنرێن

```
<p>Paragraph Text</p>
```

Paragraph Text

بۆ دەستنیشان کردنی ئاراستەی پاراگراف سیفەتی align لەتاگی pبەکاربهێنە

```
<p align="left">Left aligned paragraph</p>

<p align="center">Centered paragraph</p>

<p align="right">Right aligned paragraph</p>
```

Left aligned paragraph

Centered paragraph

Right aligned paragraph

بۆدروستکردنی لینك تاگی a بەکاربهێنە لەگەل herf بۆ دەستنیشانکردنی روو, رووەکە لەوانەیە لاپەرەیەکی html بێت ئەوکات یەکسەر ئەدرێسەکە دەست پێ دەکات :http یان لەوانەیە ئەدرێسەکە بەم شێوەیەبێت ftp یان لەوانەیە بە ئی مەیلێك بێت ئەوکات بە :mailto دەست پێ دەکات...دوایی زیاتر شارەزایت ئەبێت لەبەشەکانی تر .

```
<a
href="http://www.microsoft.com/">Microsoft
Corp.</a><br>
<a
href="mailto:mubarmej@hotmail.com">My E-mail</a>
```

Microsoft Corp.
My E-mail

بەکارهێنانێکی تریش هەیە بۆ تاگی a بەبەکارهێنانی سیفەتی name لەشوێن herf(دەش توانیت هەردووکیان بەیەکەوە بەکاربهێنیت)..لەدوایی دەتوانیت لینکێك زیادکەیت دەستنیشانی شوێنی بوونی <name a=""> بکەیت...ئەویش سیفەتی herf دەستنیشانی ناوی دیاری کراو بکات لە name لەپێشیا هێمای # بێت...بۆ نموونە ئەگەر ویستت لینکێك دابنێیت بت با بۆ شوێنێکی دیاری کراوی هەمان فایل ئەمە دروست بکە لەشوێنی داواکراو ..

<a name="myname"> .....</a>

ئینجا لینکەکە زیادئەکەیت لەهەرشوێنێك بێت بەم شێوەیەی خوارەوە

<"herf="#myname> .........</a>

بەهەمان شێوە ئەتوانیت لەنێوان فایلەکانیش ئەنجامی دەیت لە فایلێك بچێت بۆ فایلێکی تر ....بەم شێوەیەی خوارەوە:

.</a>..........<"a href="kurdishempire.htm#myname>

هەروەها ئەتوانیت لینکێك دروست کەیت بۆ سەرەوەی لاپەرەکەت بەدانانی top# لە سیفەتی .herf

بۆ ئەوەی وا لەنووسینەکە بکەیت کە بچێتە رستەیەکی ترەوە <br> بەکاربهێنە.

بۆزیادکردنی مەسافەیەك   بەکاربهێنە.

ئەتوانیت تاگی pre بەکاربهێنیت بۆئەوەی وابکەیت متصفحەکەت گوێ بەبۆشایەکان بدات...واتە یەك بۆشایی بەیەك وەرگرێت و سێ بۆشایش بە سێ بۆشایی وەرگرێت و رستەیەکی نوێ بە رستەی نوێ وەرگرێت ...تەنها لەنێوان ئەم تاگانەی دابنێ <pre>.......</pre>

دەتوانیت هەموو شتێك بخەیتە ناوەراستەوە ئەگەر بێتوو بیخەیتە نێوان تاگی <center>.....</center>

# تاگی Font

تاگی Font کاردەکات بەردەوام لەگەل کۆمەلێك سیفەتەوە, چونکە خۆی هیچ گۆرانکاریەك بەتەنها ناتوانیت ئەنجام بدات....گرنگ ترین سیفەتەکانی بریتیە لە دەستنیشان کردنی جۆری فۆنەکەو رەنگەکەی و قەبارەکەی....

یەکەم سیفەتی تاگی Font بریتیەلە سیفەتی face کە دەستنیشانی جۆری فۆنتەکە ئەکات.

```
<font face="verdana">Verdana Text</font><br>

<font face="Courier New">Courier New Text</font>
```




دوای ئەم سیفەتی Color هەیە بۆ دەستنیشان کردنی رەنگی فۆنتەکە ....سەیری رەنگەکان بکە لەخوارەوە..

```
This is <font color="red">Red</font>
and this is <font color="blue">Blue</font>
```




سیفەتی سێ یەم...بریتیە لە سیفەتی قەبارەی فۆنتی بەرکارهاتووە...حەوت جۆرە قەبارەیان هەیە, فۆنتی سەرەکی لەلاپەرەکە یەك لەم قەبارانە وەردەگرێت, بۆیە گەر ویستت قەبارەی فۆنتەکە لەیەك لە وشەکان بگۆریت یان لە بەشێکی رستەکەدا...تاگی font بەکاربهێنە لەگەل سیفەتی size بۆ گەورەکردنی قەبارەی فۆنتەکە یان بچووك کردنەوەی, گەر قەبارەی فۆنتە سەرەکیەکە 3 بێت,

دەتوانیت 4 قاتی تری بۆ زیاد بکەیت تا دەگاتە قەبارە 7 کە گەورەترینیانە, وەهەروەها ئەتوانیت دوو قاتیش بچووکی بکەیتەوە بۆ ئەوەی ببێتە قەبارە 1 کە بچووک ترینیانە, بۆیە ئەتوانیت هێمای + لەپێش ژمارەکە دانێیت بۆ ئەوەی قەبارەکەی گەورەبکات, یان هیمای – بۆ دابنێیت بۆئەوەی لەقەبارەکەی خۆی بچووک تری بکاتەوە....بەلام ئەگەر بێتوو لەژمارەی 7ی زیاتر بنووسیت ئەوا هەر بە قەبارە 7 بۆت بەدیار دەکەوێت...وەبچووک تر لە ژمارە 1 بنووسیت هەر بەقەبارە 1 بۆ بەدیار دەکەوێت.

```
<font size="+4">Size 7</font><br>

<font size="+3">Size 6</font><br>

<font size="+2">Size 5</font><br>

<font size="+1">Size 4</font><br>

<font size="0">Size 3</font><br>

<font size="-1">Size 2</font><br>

<font size="-2">Size 1</font><br>
```



ڕێگایەکی خێرا هەیە بۆ گـەورەکرن و بچـووك کردنـی قـەبارەی فۆنتەکـە بەیـەك دەرەجـە....ئـەویش بەبەکارهێنانی تاگی <big> و <small> .

```
<big>size 4</big><br>

<small>size 2</small><br>

<big><big>size 5</big></big><br>
```

size 3
size 1
size 4

ڕێگاکانی سەرەوە بۆ گۆڕینی قەبارەی فۆنتەکە پـێ ی دەوترێـت ڕێگـای relative ...چـونکە تـۆ لەسەر فۆنتی سەرەکی قەبارەی فۆنتەکە گەورەو بچووك ئەکەیتەوە, بەلام خۆ ئەتوانیت دەستنیشان قەبارەی فۆنتەکە بکەیت..بەبێ بەندبوون لەسەر فۆنتی سەرەکی ... لـەڕێگای بـەکارهێنانی سـیفەتی size بەلام بێ بەکارهێنانی هێمای + و – بەرامبەر قەبارەی داواکراو.

```
<font size="7">Size 7</font><br>

<font size="6">Size 6</font><br>

<font size="5">Size 5</font><br>

<font size="4">Size 4</font><br>

<font size="3">Size 3</font><br>

<font size="2">Size 2</font><br>
```

```
<font size="1">Size 1</font>
```




هەروەها دەتوانیت قەبارەی فۆنتی سەرەکی بگۆریت ...بەلام لەم حالەتە قەبارەی هـەموو فۆنتـەکان ئەگۆریت کە تیایدا فۆنتی سەرەکیت بەکارهێناوە...بەبـەکارهێنانی تـاگی <basefont> ...ئـەم تاگە ئەتوانیت بەکاربهێنیت بۆگۆرینی قەبارەی فۆنتی سەرەکی و رەنگەکەو یان جۆرەکەی ..چـونکە نرخێکی نسبی بۆخۆی وەرناگرێت ...بۆنموونە بۆگۆرینی فۆنتی سـەرەکی بـۆ Verdana بەقـەبارە 3 و رەنگی سەوز ئەم رستەیە لەفایلەکە ئەنووسین:

```
<basefont color="Green" size="3" face="Verdana">
```

تاگی سەرەوە بەکارنایێت لەبەشێکی دیاری کراوی نووسنەکانی HTML بەلکو گۆرانکاریەکە لەسـەر هەموو لاپەرەکە دەردەکەوێت ...بۆیە پێویستی بە تاگی کۆتایی(داخستن) نابێت.

چەندین تاگی تر هەن بۆ جوانکاری و دەستکاری کردن, بۆ نموونە تاگی b و strong بۆ پانکردنی فۆنتەکەو تاگی I و em بۆ لارکردنی فۆنتەکـەو تـاگی tt بـەکاردێت بـۆ ئـەوەی قـەبارەی پیتـەکان وەکو یەك بێت..وەکو دەست نووسی ئامێری پیت چنین.

```
<b>This</b> is Bold
        Text and <strong>this</strong> to!<br>
but <i>This</i> is
        Italic Text and <em>this</em> to!<br>

        And <tt>This</tt> is Typewriter Text
```



تاگێکی تایبەت هەیە بۆ دانانی هێڵێکی ئاسۆیی (horizontal line)..ئەویش تاگی hr کە دەتوانیت دەستنیشانی پانی هێڵەکە بەسیفەتی width بکەیت کە نرخەکانی دەبێت ژمارەی تەواو بن وەکو 10 یان 214, بەپیکسل ئەنووسرێت یان بە پێی قیاسی پانایی لاپەرەکە وەکو 20٪و 76٪, هەروەها سیفەتی size هەیە بۆ دیاری کردنی بەرزی هێڵەکە..کە نرخی بچووک وەردەگرێت...هەروەها سیفەتی Color بۆدەست نیشان کردنی رەنگی فۆنتەکە ... هەروەها سیفەتی noshade کە سیفەتێکە نرخی نابێت ...بۆیە کاتی دانانی وا لە هێڵەکە دەکات کە بەشێوەیەکی تەختە دەرکەوێت و نەوەك وەکو هێڵی ستاندەرد.

```
This is the First Line

<hr>

This is the Secound Line

<hr color="Purple">

This is the Third Line
<hr width="30%">

This is the Fourth Line

<hr noshade size="40">
```




دەتوانیت هەندێك گۆراو بەکاربهێنیت لە تاگی لەش <body> , ئەم گۆراوانە بەکاردێن بۆ دەستنیشان کردنی شێوەی لاپەرەکە وەکو رەنگی باکگراوندی لاپەرەکە bgcolor یان وێنە بکەینەباکگراوند بەهۆی سیفەتی background, یان رەنگی نووسینەکە text یان رەنگی لینکە نوێ یەکە link یان کۆنەکە vlink یان ئەوەی ئێستا دەستنیشان کراوەalink یان رۆخی سەرەوەی لاپەرەکە topmargin یان رۆخی خوارەوە buttommargin یان رۆخی چەپ leftmargin یان رۆخی راست rightmargin .

```
<body
        alink="red" link="yellow" vlink="blue"

     bgcolor="black" text="white" topmargin="0">

               This is some Text.<br>

           And here are some links :<br>
        <a
  href="http://www.kurdsite.15x.com/">Great Hacker
                Site</a><br>
       <a
     href="mailto:kurdsite@hotmail.com">Kurdish-
              Empire!?</a><br>
```

```
<a
href="http://www.msn.com/">Microsft Network</a><br>
<a
href="http://www.hotmail.com">Free E-mail</a>
</body>
```



# ئەدرێسەکانی HTML

ئەدرێسەکان لە HTML بەکاردێن بەزۆری لەگەل هایپێر لینك و وێنەکان, بۆیە دەبێت بزانیت چۆن ئەم ئەدرێسانە بەکاردێن.
دوو جۆرە ئەدرێس هەن, نسبی و رووتەك, ئەدرێسە نسبیەکان بەنسبەت ئەدرێسی ئێستای سایتەکە دەبێت, بۆ نموونە ئەگەر تۆ لەلاپەرەی http://www.microsoft.com/ie/default.asp بیت, تۆش لینکی herf دروست بکەیت download.html یەکسەر ئێکسپلۆرەرەکە دەزانێت کە تۆ لاپەرەی http://www.microsoft.com/ie/download.html داواکردووە.وەئەگەر herf یەکسان بێت بە download/English.html یەکسەر ئەتبات بۆ لاپەرەی http://www.microsoft.com/ie/download/english.html واتە ئێکسپلۆرەرەکە رستەی herf دەخاتە سەر ئەدرێسی ئێستا، جیاوازە فایلێك لەگەل گایدێك, چونکە گایدەکە (/) تیادەبێت لەکۆتایەکەیدا, لەهەر گایدێك گایدێکی تایبەت هەیە, ئەم گایدە تایبەتە, تۆ ئەبات بۆ گایدی باوك بەهۆی هێمای(..) لە نموونەکەی سەرەوە ...ئەگەر herf تیایابێت ../windows.html یەکسەر ئێکسپلۆرەرەکە دەتبا بۆ http://www.microsoft.com/windows.html واتە لە گایدی ie/ دێتە دەرەوە بۆ گایدی رەگ /.

بەلام ئەدرێسە رووتەکان...بەوە جیادەکرێنەوە کە ناوی پرۆتۆکۆلەکە لەپێشیان دێت..بۆ نموونە.. ئەدرێس http://www.kurdsite.15x.com بەئەدرێسی رووت دائەنرێت, هیچ پەیوەندی بە ئەدرێسی ئێستا نیە.

# رەنگەکان لە HTML

رەنگەکان لە کۆمپیوتەر بەرهەمدێن بەتێکەل کردنی سیٚ رەنگە سەرەکیەکەوە, ئەوانیش سوورو سەوزو شین, هەریەك لەم رەنگانە نرخێك وەردەگرێت لەنێوان 0 تا 255 دەبێت, یەك لەدوای یەك دێن ...(سوور, سەوز, شین) یان (Red, Green, Blue) یان rgb لەهەرشوێنێك پێویستت بەرەنگ هەبێت ئەم رستەیەی خوارەوە بنووسە:

rgb(R,G,B)

نرخی R لەشوێنی تایبەتی خۆی دائەنێیت , هەروەها G, B ....دەتوانیت رستەکەی سەرەوە بەشێوەیەکی تر دابرێژیت...ئەویش بەشێوەی شازدەیی...واتە ژمارەکانی سەرەوە ئەگۆریت لە سیستەمی دەیی بۆ سیستەمی شازدەیی....هەروەکو دەزانی کە بەرزترین ژمارە لەسیستەمی دەیی رەنگەکان 255 بەلام لەسیستەمی شازدەیی دەبێتە ff وەکەمترین نرخیش دەبێتە 00., واتە هەر ژمارەیەك دووخانە وەردەگرێت بەم شێوەیە...#RRGGBB, واباشە هێمای # بخەیتە پێشیەوە لەسیستەمی شازدەییدا بۆئەوەی هەموو ئێکسپلۆرەرەکان بیان ناسێتەوە, دەتوانیت ئەم نرخانەی سیستەمی شازدەیی بەدەست بێنیت بە بەکارهێنانی حاسیبەی کۆمپیوتەرەکەت. ئەمەی خوارەوەش جەدوەلێکە رەنگەکان لەگەل هێماکەیان روون ئەکاتەوە لەسیستەمی شازدەدا.

| | | | |
|---|---|---|---|
| FFFF00 | | ABCDEF | |
| 336699 | | FEDCBA | |
| 112233 | | 773466 | |
| 666666 | | FF1122 | |
| 663333 | | 0033FF | |
| 00FF00 | | AABBAA | |
| FF6600 | | 800800 | |
| 993366 | | 008008 | |
| 123456 | | 020769 | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 654321 | | 111111 | |

بەرێگای سەرەوە دەتوانیت زیاتر لە 16.5ملیۆن ڕەنگ بەرهەم بێنیت, بەلام کۆمپیوتەرەکانی کۆن نەیان ئەتوانی زیاتر لە 256 ڕەنگ بگەینێتە چاومان لەهەمان کاتدا, بۆیە لەسەر 216 ڕەنگ ڕێکەوتوونە کە ناونراوە بەرەنگە بەرهەمهاتووەکانی ئێکسپلۆرەر...ئەگەر هەموومان لەمالپەرەکانمان تەنها ئەم ڕەنگانەمان بەکارهێنا, ئەوا سەردانکەرانی مالپەران ئەتوانن زیاتر لە چەند مالپەرێك لەهەمان کاتدا بکەنەوە(سەیری بکەن), بەبێ هیچ مشکلەیەك..چونکە ئەورەنگانەی کە ئێکسپلۆرەر پێویستی پێیەتی تەنها 216 ڕەنگ دەبێت ئەوانی تر بۆ شتی تر ئەمینێتەوە.

جگە لەوەی باسمان کرد چەند ڕەنگێکی ناسراوی تر هەن کە زۆر بەکاردێن و ناوی دیاری کراویان هەیە, ژمارەیان دەگاتە 141 ڕەنگ, ئەم ڕەنگانە دەتوانی بەکاربهێنیت تەنها بەنووسینی ناوەکانیان, ئەم جدوەلەی خوارەوە بەناوبانگترینیان روون دەکاتەوە:

| ناوەکەی | سیستەمی شازدەیی | ڕەنگەکە |
|---|---|---|
| Red | #ff0000 | |
| Lime | #00ff00 | |
| Blue | #0000ff | |
| Yellow | #ffff00 | |
| Fuchsia | #ff00ff | |
| Aqua | #00ffff | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| White | | Black | |
| Green | | Red | |
| Purple | | Marron | |
| Blue | | Navy | |
| Lime | | Teal | |
| Silver | | Gray | |
| Aqua | | Olive | |
| Yellow | | Fuchsia | |

نموونە بۆ روونکردنەوە:

```
<font size="+1">

<font color="Khaki"> Sample 1 </font><br>

<font color="#0066cc"> Sample 2 </font><br>

<font color="rgb(204,112,202)"> Sample 3 </font><br>

</font>
```



# وێنەکان

لـە زمـانی HTML ئـەتوانیت وێنـە نیشـان دەیـت لەلاپــەرەکانی ئەنتــەرنێت و کـۆنترۆلیش لەسـەر سـیفەتەکانیەوە بکـەیت, پـێش هـەموو شـتێك پێویسـتە وێنەکـەت ئامادەبێـت بـۆ بلاوکردنـەوەی لەئەنتەرنێت, بەلام نابێت قەبارەکەی یەکجار زۆربێت, چونکە ئـەوکات زۆر بەسـەبری تحمیـل ئـەبێت, بۆیە پێویستە زۆر ئاگـاداربین کاتێـك کـار لەگـەل وێنـە ئەکـەین, چـونکە وێنـەکان قەبارەیـەکی زۆری لاپەرەکەت دەگرن و بەمەش خێرایی تحمیلی مالپەرەکەت کەم ئەبێتەوە.

بۆئەوەی بتوانیت وێنەکەت دەربکەیت لەلاپەرەکەت پێویستە وێنەکانت لەجۆری jpg و gif بێت.

# زیادکردنی وێنەکان

لەزمانی HTML ئەتوانیت وێنەکان زیادبکەیت بەهۆی تاگی IMG, کە تاگێکی تاقانەیەو پێویسـتی بـە تـاگی کۆتـایی(داخسـتن) نابێـت, بـەلام پێویسـتی بـە سـیفەتێکی زۆر گـرنگ هەیـە بۆئـەوەی بەشێوەیەکی باش کاربکات, ئەویش scr کە ئەدرێسی وێنە داواکراوەکەی دەخەینە ناویەوە.

```
<img src="/images/sample.gif">
```

سیفەتی width بۆ دیاریکردنی پانی وێنەکە, height بۆ دیاری کردنی بەرزیە...بەم دوو سـیفەتە دەتوانین قەبارەی وێنەکە گەورەو بچووك بکەین, دەتوانیت لەسەرەتادا دەست لەم ژمارانـە نـەدەیت, بەمەش ئێکسپلۆرەرەکە قەبارەیەکی بچووکی بۆ دابین ئەکات تا وێنەکە بەتەواوی وەرئـەگرێت ئینجـا بەقــەبارەی ئاسـایی خـۆی دەریـدەکات, بۆیــە کـاتی دەرچـوونی وێنەکــە هەنـدێك نووسـینەکان پالـدەدات...چـەند وێنەکـە گـەورە بێـت زیـاتر پـال بەنووسـینەکان دەنێـت, ئـەی ئەگـەر وێنەکـەی نەدۆزیەوە, هەر قەبارە بچووکەکەی بۆ دەگرێت, بەمەش لاپەرەکەت شێواوو نارێك دەردەچێت.

```
<img src="/images/sample.gif"

width=73 height=68><br><br>

<img src="/images/sample.gif"

width=200 height=100>
```



هەروەها سیفەتی align یش هەیە لە سیفەتە گرنگەکانی وێنەیە, چونکە تەنها رێگەیە بۆ چۆنیەتی دەرکەوتنی وێنەکە بەنسبەت نووسینەکان, وێنەکان لە HTML بەبەشێکی نووسینەکانی دەوروبەری دائەنرێت, لەگەلیا جوولە ئەکات و پێیانەوە لکاوە, سیفەتی align چەند نرخێك وەردەگرێت :–

*bottom, baseline, absbottom: ئەم سیفەتانە وێنەکان بەدیاردەیەخن لە رستەدا وەکو ئەوەی نووسین بێت.

```
<img
    src="/images/sample.gif" align="bottom">
```



*left: ئەم سیفەتە وێنەکان لەلای چەپی پاراگرافەکە(فقرە) بەدیار دەیەخیت, هیچ پەیوەندی بە رستەکەوە نابێت.

```
<img
src="/images/sample.gif" align="left">
```




*middle, absmiddle: وێنەکان لەناوەراستی رستەکە بەدیار دەیەخیت.

```
<img src="/images/sample.gif" align="middle">
```




*right: وێنەکان لە لای راستی پاراگرافەکە(فقرە) بەدیار دەخات, بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندی بە رستەکەوە بێت.

```
<img
    src="/images/sample.gif" align="right">
```




*top, texttop: وێنەکان لەخوارەوەی رستەکە بەدیار دەخات, واتە رستەکە دەکەوێتە سەریەوە.

```
<img
    src="/images/sample.gif" align="right">
```




هەروەها سیفەتێکی تر هەیە بۆ دروست کردنی چوارچیوە بۆ وێنەکان ...بریتیە لە border کە پانی چوارچیوەکە بە پیکسل دادەنرێت, نرخی 0 مانای بێ چوارچیوەیی دەگەیەنێت, ئەگەر نرخێك لەسیفەتی border لەتاگی وێنە دیاری نەکەیت, وێنەکە بەبێ چوارچیوە دەردەکەوێت بەلام بەچوارچیوە دەبێت ئەگەر لینکداربێت, بۆیە زۆرمان نرخی "border=0" بۆ هەموو وێنەکان دادەنێیت بۆئەوەی بێ چوارچیوە دەرچێت ئەگەریش وێنەکە خاوەن لینکداریش بێت.

```
<a href="http://www.microsoft.com/">

<img src="/images/sample.gif"></a><br>

<a href="http://www.microsoft.com/">
<img
  src="/images/sample.gif" border="0"></a><br>

<img src="/images/sample.gif" border="3">
```



دەتوانیت دەستنیشانی پانی حاشیەی دەوری وێنەکە یان مەسافەی نێوان نووسینەکەو وێنەکە بکەیت بەهۆی سیفەتی hspace

هەروەها سیفەتی alt بۆوێنە هەیە, کە بەکاردێت بۆ وەسف کردنی وێنەکە, چونکە ئەو نووسینەی کە دەخەیتە ناو سیفەتی alt لەشوێن نووسینەکە دەردەکەوێت, لەشوێن وێنەکە تا وێنەکە بەتەواوی تحمیل ئەبێت, یان ئەوکاتەی ئێکسپلۆرەرەکە وێنەکە نەدۆزێتەوە, ئەم نووسینانە لە چوارگۆشەکی ToolTip دەردەکەوێت کاتی ماوسەکەت ئەبەیتە سەر وێنەکە.

## خەریتەی وێنەکان

لەهەندێك حالەتدا وێنەیەك ئەبینیت زیاتر لەیەك خالی گرنگی لەسەرە Hot Spots, ئەم وێنانە دابەش ئەکرێن بۆچەند بەشێك وەکو خەریتە, ئەوەی خوارەوە باسی چۆنیەتی ئەم کارە روون ئەکاتەوە:

خەریتەی وێنەکان پێکهاتووە لە دووبەشەوە.... خەریتەکەو وێنەکە, چونکە تۆ دیزاینی خەریتەکە دەکەیت ئینجا ناوێکی لێ ئەنێیت, ئینجا ناوەکە لە سیفەتی usemapی وێنەکە دەنووسین.

لەسەرەتادا بابزانین چۆن خەریتەی وێنەکە پێك دەهێنین



ئەگەر بمانەوێت وێنەکەی سەرەوە دابەش بکەین....دابەشەکە(خریتەکە) بەم شێوەی خوارەوەی لیّ دێت:



هەربەشێك لەم بەشانەی سەرەوە بەشێکی گرنگی سایتەکە دەنوێنێت, کاری ئێمە وێنەکێشانی خەریتەکەی سەرەوەیە..وەدیار کردنی خالە گەرمەکانی لینکەکانە, ئەمەش بەهۆی تاگی map دەبێت, ناوی خەریتەکە بەسیفەتی name دیاردەکەین, شێوەکان دەخەینە نێوان تاگی کردنەوەو داخستن map, شێوەکانیش لەسەر وێنەی تاگی area تاك دەبێت, شێوەکان دیاری دەکەین بەهۆی سیفەتی shape, ئینجا لینکەکە دەیاری دەکەین بەهۆی سیفەتی herf ئینجا کۆردینەیتەکە بەهۆی سیفەتی cords, بۆیە هەر شێوەیەك لەوەی ترجیایە بەهۆی ئەم کۆردینەیتانەوە....ئەم سیّ شێوەیە بریتیەلە:

*Circle: بریتیە لەشێوەی بازنە, بۆیە کۆردینەیتەکانی بریتیە لە x, y بۆ چەق و ئینجا نیوە تیرەکەی(X, Y, radius).

*rect: بریتیەلە شێوەی چوارگۆشە, کۆردینەیتی x,y بۆ کۆرنەی سەرەوەی چەپ, لەگەل کۆردینەیتی x,y بۆ کۆرنەی بەرامبەرەکەی لای خوارەوەی راست...(x1,y1,x2,y2)

*poly: شێوەی پێنجی, دەشتوانیت وێنەی بکێشیت بەهۆی کێشانی چەند راستە هێلێکەوە, بەمەش کۆردینەیتەکە (x1,y1,x2,y2, .......xn,yn).

پێویستیشە بزانیت کە خالی سەرەوەی چەپ خالی سفر دەبێت, هەرچەندە بۆ خوارەوە بێیت نرخەکە زیاد ئەکات بۆ Y, وە هەرچەندە بەرەو چەپ برۆیت نرخەکە زیاد ئەبێت بۆ X.

بۆ زانینی کۆردینەیتی پێویست, دەتوانیت بەرنامەکانی وێنە بەکاربهێنیت وەکو بەرنامەکانی Adobe Photoshop, Paint Shop Pro.

لە نمونەکەی سەرەوە ئەم کۆردینەیتانە حساب کراوە ...بۆیە ئەنجامەکەی بەم شێوەیەی لیّ دێت:

```
<img src="/images/sample2.gif" usemap="#mymap">

<map name="mymap">

<area
 shape="rect" href="http://www.kurdsite.15x.com/"

     coords="6,10,67,44">
<area
shape="circle" href="http://www.kurdsite.15x.com/"

     coords="121,93,27">
<area
 shape="poly" href="http://www.kurdsite.15x.com/"

coords="37,90,73,105,59,129,15,129,4,105">

</map>
```



ئێستا بۆت روون بۆوە کە وێنەکە دابەش کراوە بۆ چەند خالێکی گەرم, هەریەکەیان لینکێکی جاواز لەوەی تری دەبێت, کاتی کلیك کردن لەسەر هەریەکەیان چوارچیوەیەکی رەشی بۆ دروست دەبێت, دەتوانیت ئەم چوارچیوەیە لادەیت یان کۆنترۆلی پانی بۆ بکەیت بەهۆی سیفەتی border لەتاگی shape, هەروەها دەتوانیت alt جاوازیان بۆ دیاربکەیت لەتاگی shape.

```
<img
src="/images/sample2.gif" usemap="#mymap" border="0">

<map name="mymap">
<area
shape="rect" href="http://www.kurdsite.15x.com/"
coords="6,10,67,44"


border="0" alt="Be Happy">
<area
shape="circle" href="http://www.kurdsite.15x.com/"

coords="121,93,27"

border="0" alt="Enjoy!">
<area
shape="poly" href="http://www.kurdsite.15x.com/"

coords="37,90,73,105,59,129,15,129,4,105"

border="0" alt="Best Downloads">
```

# ڕێکخستنی ناوەڕۆك

دەتوانیت ناوەڕۆکی فایلەکان لە زمانی HTML ڕێك خەیت بەچەند شێوەیەك, دەتوانیت لە شێوەی تری Tree پۆلینی بۆ بکەیت, یان بەشێوەی هەرەمی .... بەلام گرنگترینیان ڕێکخستنی جەدوەلی دەبێت.

دەتوانیت جۆری ژمارە ڕێژ کردنەکەشی بۆ دیاری بخەیت, ئایە ژمارەیی بێت یان پیتی ئینگلیزی یان ڕۆمانی ....بەهۆی سیفەیتی type کە یەك لەم نرخانە وەردەگرێت:

**1 :** 1, 2, 3, 4, ..

**a :** a, b, c, d, ..

**A :** A, B, C, D, ..

**i :** i, ii, iii, iv, ..

**I :** I, II, III, IV, ..

یان لەشێوەی لیستی نارێك:

- **circle :**
  - o
- **square :**
  - ▪
- **disc :**
  - •

هەروەها ئەتوانیت لیستێك بخەیتە ناو لیستێکی ترەوە بۆئەوەی شێوەیەکی هەرەمی دروست بکەیت.

```
<ul type="circle">
```

```
<li>Pepsi
<li>Crash
<li>7 Up
</ul>

<ol type="I">
<li>Windows (85%)
<li>Linux (10%)
<li>Mac (3%)
<li>Other (2%)
</ol>

<ol>
<li>American Companies
```

```
<ol>

<li>Microsoft

<li>General Motors

</ol>


<li>German Companies

<ol>

<li>Dubian

<li>BMW

<ul>

<li>6 Class

<li>7 Class

</ul>

</ol>
```

```
</ol>
```

- Pepsi
- Crash
- 7 Up

I. Windows (85%)
II. Linux (10%)
III. Mac (3%)
IV. Other (2%)

1. American Companies
   1. Microsoft
   2. General Motors
2. German Companies
   1. Dubian
   2. BMW
      - 6 Class
      - 7 Class

# جەدوەلەکان

جەدوەلەکان بەگرنگ ترین پێکهێنەرەکانی لاپەرەکانی HTML دێن, بەلکو هەموو مالپەرێکی پرۆفیشنەلی وێب کەلەلایەن محتەریفانی وێب دیزاین دروست دەکرێت سوودێکی زۆر زۆر لە جەدوەل ئەبینێت, بۆ دابەش کردنی ناوەرۆکەکان و نوسین, هەریەکەیان شوێنێکی دیاری کراوی بۆ دادەنرێت ...دەتوانیت جەدوەل زیادکەیت بەهۆی تاگی table ئینجا لەناو جەدوەلەکە پێویستە ریز(رۆ) tr زیادکەین, هەروەها ئەتوانیت چوارچیوە بۆ جەدوەلەکە زیاد کەیت بەهۆی سیفەتی border کە پانی هێلی چوارچیوەکە ئەنوسین ...نرخی 0 مانای بیٚ چوارچیوەیە.

| | |
|---|---|
| <TABLE BORDER="5"><br><TABLE BORDER="0"> | **BORDER** |
| <TABLE WIDTH="600"><br><TABLE WIDTH="80%"> | **WIDTH** |
| <TABLE HEIGHT="500"><br><TABLE HEIGHT="100%"> | **HEIGHT** |
| <TABLE CELLSPACING="10"> | **CELLSPACING** |
| <TABLE CELLPADDING="10"> | **CELLPADDING** |
| <TABLE ALIGN="Left"><br><TABLE ALIGN="Right"> | **ALIGN** |
| <TABLE BGCOLOR="#00FFFF"> | **BGCOLOR** |

```
<table border="1">
```

```
  <tr>
    <td>First Row - First Data
    <td>First Row - Secound Data
  </tr>
  <tr>
    <td>Secound Raw - First Data
    <td>Secound Raw - Secound Data
  </tr>
</table>
```

| | |
|---|---|
| First Row - First Data | First Row - Secound Data |
| Secound Raw - First Data | Secound Raw - Secound Data |

دەتوانیت دەستکاری مسافەی نێوان خانەکان بکەیت بەهۆی سیفەتی cellspacing, یان مەسافەی نێوان چوارچیوەی ژوورەوەی خانەکان لەگەل ناوەرۆکی خانەکان بەهۆی سیفەتی cellpadding.

```
<table
  cellspacing="10" cellpadding="20" border="1">
```

```
  <tr>

    <td>First Cell</td>

    <td>Secound Cell</td>

  </tr>

</table>
```




ئەتوانیت دەستکاری پانی جەدوەلەکە بکەیت بەهۆی سیفەتی width وە بەرزیەکەی بەهۆی height هەرەیەکەیان نرخێکی تەواو وەردەگرن یان بەنسبەی سەدی, ئەم سیفەتانە ئەتوانیت لە خانەکانی td بەکاربهێنیت.

```
<table
        width="100%" height="100%" border="1">

          <tr>


        <td width="100" height="40%">First Cell
    <td
        width="100%" height="40%">Secound Cell
```

```
</tr>

<tr>


<td width="100" height="60%">First Cell
<td
width="100%" height="60%">Secound Cell

</tr>

</table>
```

| | |
|---|---|
| First Cell | Secound Cell |
| First Cell | Secound Cell |

دەتوانین دەستکاری رەنگی باکگراوندی جەدوەلەکە بکەین بەهۆی سیفەتی bgcolor یان وێنەیەك بکەینە باکگراوند بەهۆی سیفەتی background, ئەم سیفەتانە بەکاردێت لەگەل خانەکانی td, کاتی دانانی نرخی bgcolor بۆ جەدوەلەکە..بەلام ئەم نرخە جیابێت لەگەل نرخی یەك لەخانەکان, ئەوا لەناو ئەم خانەیە باکگراوندی جەدوەلەکە دەرناکەوێت چونکە خانەکە خۆی باکگراوندێکی تری هەیەو, وە لەسەرەوەی جەدوەل دێت لەڕێزبەندی.

```
<table border="1"
background="sample.gif" width="90%" height="80%">
```

```
<tr>
  <td bgcolor="Yellow">First Cell
  <td>Secound Cell
</tr>
</table>
```




دەتوانیت دەستکاری خانەکان بکەیت بەشێوەی ئاسۆیی align و ستوونی valign , لە سیفەتی align نرخی چەپ left مانای بۆلای چەپ دێت و right بۆ راست دێت, center بۆ ناوەراست و justify بۆ ئەوەی هەموو رستەکان لەدرێژیدا وەکو یەکی لێ بێت, بەلام سیفەتی valign نرخی top بۆ سەرەوە, bottom بۆ خوارەوە middle بۆ ناوەراست

```
<table border="1" width="90%" height="80%">
  <tr>
<td
  align="right" valign="bottom">First Cell
```

```
    <td
        align="left" valign="top">Secound Cell

          </tr>

                </table>
```




هەروەها ئەتوانین جەدوەلێك بخەینە ناو جەدوەلێكی ترەوە, ئەویش بەهۆی ئەوەی جەدوەلەكە بخەیتە ناو یەك لە خانەكانی td.

```
          <table width="95%" border="1">

      <tr>

        <td>First Table - First Cell

        <td>

          <table border="1">
```

```
        <tr>

        <td>Secound Table - First Cell

      <td>Secound Table - Secound Cell

        </tr>

      </table>

  </tr>

  <tr>

    <td>

      <table border="1">

        <tr>

           <td>Third Table - First Cell

        <td>Third Table - Secound Cell

        </tr>

      </table>
```

```
    <td>First Table - Fourth Cell

  </tr>

</table>
```

<table border="1">
<tr>
<td>First Table - First Cell</td>
<td><table border="1"><tr><td>Secound Table - First Cell</td><td>Secound Table - Secound Cell</td></tr></table></td>
</tr>
<tr>
<td><table border="1"><tr><td>Third Table - First Cell</td><td>Third Table - Secound Cell</td></tr></table></td>
<td>First Table - Fourth Cell</td>
</tr>
</table>

هەروەها ئەتوانیت خانەکانی ئاسۆیی لەگەل یەك دەمجیان بکەیت بەهۆی سیفەتی colspan وە خانەکانی ستوونی بەیەکەوە بەهۆی سیفەتی rawspan, کە لەهەریەکەیان ژمارەی ئەو خانانە دەنووسیت کە ئەتەوێت بەیەکەوە دەمجیان کەیت, دەتوانیت ئەم سیفەتانە لەگەل خانەی td بەکاربهێنیت.

```
<table border="1">

  <tr>

<td rowspan="2" colspan="2">First Cell

    <td>Secound Cell

    <td>Third Cell
```

```
  </tr>

  <tr>

    <td rowspan="3">Fourth Cell

    <td colspan="2">Fifth Cell

  </tr>

  <tr>

    <td>Sixth Cell

    <td>Seventh Cell

    <td>Eighth Cell

    <td>Nineth Cell

  </tr>

</table>
```

<table>
<tr><td rowspan="2" colspan="2">First Cell</td><td>First Cell</td><td>Secound Cell</td><td></td></tr>
<tr><td rowspan="2">Third Cell</td><td colspan="2">Fourth Cell</td></tr>
<tr><td>Fifth Cell</td><td>Seventh Cell</td><td>Eighth Cell</td><td>Ninth Cell</td></tr>
</table>

# فرەیمەکان

فرەیمەکان Frame بەکاردێت بۆ دابەش کردنی ئێکسپلۆرەر بۆ چەند بەشێکەوە, تا بتوانیت چەند لاپەرەیەك پیشان دەیت, هەروەها دەتوانیت فەرمانەکان ئالوگۆر کەیت لەنێو ئەم لاپەرانەوە, دەتوانیت لاپەرەیەکی سەربەخۆ بۆ ئیندێکسی سایتەکە دروست کەیت, ئینجا دەیخەیتە فرەیمی لای چەپ بۆئەوەی بەردەوام لەوێ بمێنێتەوە, واتە هەرچەندە کلیکت لەسەر هەرلینکێك کرد لەفرەیمی چەپ لاپەرەی تایبەت بەم لینکەت لە فرەیمەکەی تر بۆت دەردەچێت کە ئەم فرەیمەیان گەورەترین بەش ئەگرێت, ئەم رێگەیان زۆرکات ئەنجام ئەدرێت بۆ ئاسان کردنەوەی مالپەرەکەت, بابزانین چۆن ئەم کارە ئەکرێت:

لەسەرەتادا لاپەرەی فرەیمەکان دەبێت هەبێت, بۆئەوەی دیزاینی بەکۆمەلی فرەیمەکانی پێ بکەیت, ..ئەو لاپەرانە چین کە پێویستە پیشانیان بدات, هەر فایلێك خەزن بکرێت لەفایلێکی سەربەخۆدا, لەلاپەرەکانی فرەیمەکاندا, تاگی فرەیمەکانی بۆ بەکاردێت....بەلام ئەوانی تری لاپەرەی سادە دەبن, بەبێ فرەیم.




یەکەم تاگی فرەیمەکان, تاگی frameset کە کۆمەلێك فرەیم ئەکاتەوە, لەم کۆمەلەدا , چەند تاگێکی فرەیم frame ی تاك هەیە, سەرچاوەی لاپەرەکە لە سیفەتی scr دادەنرێت یان دەتوانین frameset بخەینە ناو frameset ی یەکەم, تاگی frameset دەخرێتە دەرەوەی بەشی لەشbody.

لەتاگى frameset دەستنيشانى دابەشكردنەكە دەكەيت ئايە بەشێوەى ئاسۆيى يان ستوونى ئەبێت, جگە لە دياريكردنى قەبارەى هەر فرەيمێك, ئەگەر بمانەوێت دابەش كردنەكە ستوونى بێت لەشێوەى كۆلۆم سيفەتى cols بەكاردێت, ئينجا پانى هەر فرەيمێك ديار دەكەين بەمەرجێك هەرفرەيمێك بە هێماى (,) لەيەكيان جيا ئەكەينەوە, بەلام گەر بمانەوێت دابەش كردنەكە بەشێوەى ئاسۆيى بێت, هەمان كار ئەنجام ئەدەين بەلام بەبەكارهێنانى سيفەتى rows لەشوێن cols , بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت لاپەرەكە دابەش كەين بەشێوەى ستوونى بۆ سێ كۆلۆم, يەكەم بە پانى 100 پيكسل وەدووەم بۆ نسبەى 10٪ى شاشە, سێيەميش پاشماوەكە دابگرێت.... كۆمەلە تاگەكان بەم شێوەيان لىَ دێت:

```
<frameset cols="100,10%,*">

<frame src="sample1.html">

<frame src="sample2.html">

<frame src="sample3.html">

</frameset>
```




هەروەكو باسمانكرد ئەتوانيت frameset ێكى تر لەشوێنى يەك لە frame ەكان دابنێيت.

```
<frameset rows="50,*">
  <frame src="sample1.html">
  <frameset cols="100,*">
    <frame src="sample2.html">
    <frame src="sample3.html">
  </frameset>
</frameset>
```




دەتوانی ئەو فرەیمە لابەریت کە لەچواردەوری لەوحەکان دەردەکەوێت بەهۆی سیفەتی frameborder ئەگەر نرخی 0 بۆدانێیت دەرناکەوێت, نرخی 1 دەردەکەوێت, هەروەها دەتوانیت دەستکاری قەبارەی فرەیمەکە بکەیت بەهۆی زیادکردن یان کەمکردنی مەسافەی نێوان لەوحەکان. بەهۆی سیفەتی framespacing هەر نرخێکت بوێت بۆی دائەنێیت, دەتوانیت نرخی 0 بۆ دوو سیفەتەکەی پێشەوە بەکاربهێنیت بۆئەوەی نەتوانرێت دەستکاری قەبارەی لەوحەکان کرێت.

```
<frameset
 cols="50%,*" frameborder="0" framespacing="0">

<frame src="sample1.html">

<frame src="sample2.html">

</frameset>
```




ئەتوانیت دەستکاری چۆنیتەی دەرچوونی Scroll Bars بکەیت لەهەر فرەیمەکیان بێت بەهۆی سیفەتی scrolling, ئەویش نرخی yes بۆ دەرکەوتنی ئەم شەریتە وەردەگرێت, وە نرخی no بۆ دەرنەکەوتنی ئەم شەریتە دەبێت, یان auto بۆ دەرکەوتنی کاتی پێویست.

```
<frameset rows="20,*">

<frame src="sample1.html" scrolling="no">

<frameset cols="100,*">

<frame src="sample2.html" scrolling="yes">
```

```
<frame src="sample3.html">

</frameset>

</frameset>
```




بۆئەوەی بتوانیت فەرمانەکانت لە لەوحێك بۆ ئەوەی تر بنێریت, پێویستە ناو یان ئەدرێس بۆ لەوحەکان بنێیت بەهۆی سیفەتی name, دوای ئەمە بۆدورست کردنی لینك بەهۆی تاگی a سیفەتی target بەکاربهێنە, دەتوانیت لینکەکە لەشاشەی ئێکسپلۆرەرێکی نویٚ بکەیتەوە _blank یان لەهەمان شاشەی ئێستا لەسەر کۆمەلی لەوحەکانی _top یان لەلەوحی ئێستامان_self یان لەلەوحی باوك _parent .

```
<!--    sample4.html    -->

<a href="sample1.html"

target="_blank">Page 1</a><br>

<a href="sample3.html"
```

```
 target="_top">Page 3</a><br>
        <a href="sample2.html"
 target="main">Page 2</a>
        <a href="sample4.html"
 target="main">Page 4</a>
        <frameset rows="20,*">
  <frame src="sample1.html">
  <frameset cols="200,*">
    <frame src="sample4.html">

<frame src="sample3.html" name="main">
  </frameset>
        </frameset>
```




جۆرە فرەیمێکی تری تایبەت هەیە کە بەردەوام هەلواسراوە لە ناو فایلەکەوە وەکو وێنەیەك, ئەم جۆرە فرەیمانە لەهەر شوێنێکی کۆدەکان بێت دائەنرێت لەژێر بەشی body, ئینجا فرەیمێك دروست ئەکات بۆئەوەی لاپەرەکەی HTML دەرەوە پیشان بدات, تاگی iframeی بۆ بەکاردێت لەگەل سیفەتیScr, کە فایلە دەرەکیەکەی بۆ دیار دەکات, یان دەتوانیت ئەدرێسی بکەیت بەهۆی سیفەتی name یان لینکی ئاراستەکراوەی بۆ بکەیت هەروەك فرەیەمە ئاسایەکانی تر, پانی و بەرزی بەهۆی سیفەتەکانی width, height بۆ دیاری دەکەیت.

# سەمپلینگ..فۆرم..نموونەکان

## ناردنی زانیاری بەهۆی http

کاتێك ئەتەوێت زانیاریەك لە ئێکسپلۆرەرەوە بۆ سێرڤەری وێب بنێریت, تۆ بێگومان پرۆتۆکۆلی http بەکاردەهێنیت بۆ ئەم کارە, پرۆتۆکۆلی http زانیاریەکان ئەنێرێت لەشێوەی جووتەك, هەر جووتەکێك بریتیە لە ناوو نرخەکەی, بۆنموونە ئەگەر بتەوێت ناوی بەکارهێنەرەکە بنێریت بەهۆی پرۆتۆکۆلی http تۆ بەم شێوەیە ئەنێریت (وەك نموونەیەك)...name=Kurdish-Empire , ئەمە پێی ئەوترێت جووتەك چونکە لەدووبەش پێك دێت, بەشی یەکەم, ناوی زانیاریەکەیە(name), وەبەشی دووەم زانیاریەکەیە(Kurdish-Empire) ئەگەر ویستت زیاتر لەزانیاریەك بنێریت, پێویستە بەهۆی هێمای & لێکیان جیابکەیتەوە, ئەگەر ویستت ناوەکەت و ناوی شارەکەت بنێریت, بەم شێوەیە دەبێت بینێریت country=Kurdistan&name= Kurdish-Empire یان بەم شێوەیەش ئەبێت بینووسیت country=Kurdistan&name=Kurdish-Empire چونکە ڕێزبەندیەکە گرنگ نیە, جگە لەوانەی باسمان کرد چەند شەرتێکی تر هەیە بۆ ناردنی زانیاری, پێویستە متابق بێت لەگەل url, یەکەم شت ئەوەیە کە تۆ ناتوانیت بۆشایی هەبێت لەناردنی زانیاریەکە بۆیە وا ڕێك کەوتوون کە بۆشایی بگۆرێت بۆ هێمای +, واتە ئەگەر شارەکەت United States , ئەوا رستەی زانیاریەکانت بەم شێوەیە دەبێت country=United+States& name=Kurdish-Empire ....جگە لەچەند شەرتێکی تری گرنگ وەك گۆرینی هێماکانی زمانەکانی تر بۆ ئینگلیزی .....هتد, بۆ ئەوەی زانیاریەکان ئامادەبێت بۆ ناردن.

## پێناسە

بۆشایی سپی: بریتیە لە بۆشایی(مسافه) یان رستەی نوێ یان بۆشایەکانی تاب Tab

ناردنی زانیاری بەهۆی پرۆتۆکۆلی http بەهۆی دووریگاوە دەبێت, یەکەمیان پــێ ی دەوترێت get ئەوەی تریشیان post, زانیاریەکان بەرێگای get بەشـێوەیەکی زۆر سـادە ئـەنێرێت, کـە بریتیەلـە بەشێك زیاد ئەکرێتە سەر ناوی بەرنامەکەی کە سوود لەزانیارەیەکانەوە وەردەگرێت, بۆ نموونە ئەگەر بەرنامەیەکت هەبێت نـاوو نـاوی شـاری هـەبێت لەسـەر سـێرڤەرەکە خـەزنی بکـات, وە ئەدرێسـی ئـەم بەرنامەیە بەم شێوەیە بێت http://somewhere.com/script.cgi

لەرێگای getتەنها هێمای ؟ بۆزیاد ئەکاتە سەر رستەی زانیاریەکان بەمەش ناوەکەی بـەم شـێوەیەی لێـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــدێت:

http://somewhere.com/script.cgi?name=mubarmej&country=United+States بێگومـان تـۆ تووشـی شـتێکی وا بوویـت, بـەلکو زۆر لـەوە معقـد تـر . بـەلام لەرێگایpost خۆی بەتـەنها ئـەنێردرێت هـیچ زانیاریـەك لەئـەدرێس بـار دەرناکـەوێت, بۆیـە ئـەم دوو رێگایـە لەیـەکتر جیـاوازن, رێگـای get زۆر ئاسـانترە بـەلکو زۆر بەئاسـانی دەتوانیـت وەکـو لینکێـك بـەکاربیهێنیت, بـەلام لـەرێگای post ناتوانیـت بیکەیتـە سـەر شـێوەی لینـك, واتـە تـەنها لـەرێگای سەمپلینگ کاردەکات, (بەلکو هەردووکیان لەگـەل سـەمپلینگ زۆر بـەرێکی کاردەکـەن), بـەلام رێگـای post باشترە بۆ ناردنی زانیاری زۆر وەکو ناوەرۆکی نامە, کەئەمە زۆر گرانـە بـەهۆی get ئـەنجامی بدەیت, هەروەها زانیاری و اتصـالە نهێنیـەکان دەبێـت بـەهۆی ئـەم رێگایـە بێـت(نـەوەك ئـەم رێگایـە پاراستراوە, بەلکۆ هەندێك معقدە).

## کاری سەمپلینگ...فۆرم

دوای ئەوەی زانیت کە چۆن زانیاری ئەنێردرێت, پێویستە کاری سەمپلینگ بزانیت, سەمپلینگ واجهەیەکی زۆر ئاسانت ئەداتێ بۆ داخل کردنی زانیاریەکان, وەکو چوارگۆشەی نووسین و لیستی هەلبژاردن و چوارگۆشەی yes/no , ...هتد, ئەوەی لەسەرتە تەنها دەستنیشان کردنی شوێنی بەرنامەکە (http://somewhere.com/script.cgi) هەروەکو لەنموونەکەی سەرەوەدا, رێگای (get, post) وەناردنی زانیاریەکان, و دیاری کردنی هەندێك رەنگ و قەبارەکەو دیزاینی فیلدەکان و دانانی دووگمەی (Submit) هیچی تر نا..., ئێستا لەسەر سەردانکەرانی مالپەرەکەت تەنها هەندێك فیلد پربکاتەوەو هەندێکی تر هەلبژێریت, ئینجا کلیك لەسەر دووگمەکە بکات بۆناردنی زانیاریەکان

ئینجا ئێکسپلۆرەرەکە زانیارەکان کۆدەکاتەوەو دەیانگۆڕیتەوە بۆ زمانی خۆی و ئامادەی ئەکات دوایی بۆ شوێنەکەی داوات کردووە دەنێریت....بۆیە فۆرم شتێکی زۆر کارایە لەزمانی HTML.

فۆرمەکان بەهۆی تاگی form زیادئەکرێن, وەزانیاریەکانیش لەشێوەی تاگی inputی تاك دائەنرێن, تاگی form کۆمەڵێك سیفەتی هەلگرتووە, گرنگترینیان action کە بەهۆیەوە دەستنیشانی ئەدرێسی بەرنامەکە دەکرێت, سیفەتی دووەم method کەبەهۆیەوە دەستنیشانی جۆری گواستنەوەکە دەکرێت..post or get, بەلام تاگی input گرنگترین سیفەتی type دەبێت, کە تیایدا دەستنیشانی جۆری ئۆبگێکتەکە دەکرێت...وەیەك لەم نرخانە وەردەگرێت:

*Text: بەناوبانگترین رێگای ناردنی زانیاری دەبێت..لە فۆرمەکە بەشێوەی چوارگۆشەیەك دەردەچێت کە دەتوانیت زانیاری تیا بنووسیت.

*Button: بۆ دروستکردنی دووگمە بەکاردێت.

*Checkbox: بۆدروستکردنی چوارگۆشەی هەلبژاردن, ئەگەر هەلیبژێریت هەلبژاردەی onئەنێریت, ئەگینا هیچ زانیاریەك نانێریت.

*File: بۆ ناردنی فایلەکان.

*Hidden: بۆناردنی زانیاریەکان کە تۆ ئەتەوێت, بەبێ ئەوەی هیچ شتێك دەرکەوێت لەلاپەرەکەی HTML , دەتوانیت بەهۆیەوە زانیارەکان بەیەکەوە بلکێنیت لەفایلەکە بێ ئەوەی بەکارهێنەران بیزانن.

*Image: بەکاردێت لەزۆر کاتدا وەکو دووگمەکان.

*Password: بەکاردێت بۆناردنی ووشەی نهێنی, بەلام بەبێ ئەوەی کرداری تشفیری بۆبکات, بەلکو وەکو چوارگۆشەی ئاسایەکانی نووسینە بەلام ووشەکانی تیادا بەشێوەی(*) دەردەکەون.

*Radio: بۆدروستکردنی بازنە بۆئەوەی بەکارهێنەران یەك لە هەلبژاردەکان هەلبژێرن.

*Reset: بەکاردێت بۆرەش کردنەوەی ناوەڕۆکی فۆرمەکە, گەڕاندنەوەی بۆ باری سەرەکی.

*Submit: لەشێوەی دووگمەیەك دەردەکەوێت بۆناردنی زانیاریەکانی ناو فۆرمەکە بەکاردێت.

هەروەها ئەتوانیت بەهۆی دوو تاگی ترەوە زانیاری لەگەل فۆرمەوە بنێریت, کە لەگەل تاگی form دائەنرێت ئەم دوو تاگانە بریتین لە تاگی select کە چەند تاگێکی option دائەنێیت هەریەکەیان پاراگرافێك لە لیستەکە دەنوێنێت, هەر پاراگرافێك نرخێکی دەبێت.

## تێبینی

تۆ تائێستا بەرنامەیەکی بچووکت دروستکرد لەسەر سێرڤەرەوە زانیاریەکان وەردەگرێت, بەیەك لەرێگاکان ئەینێریت, دوایی ئەنجامەکەت بۆ ئەگەرێنێتەوە لەشێوەی جەدوەلێك .

ناوی بەرنامەکە echo.pl ...ئەم فایلە لەهەمان فۆلدەر ئەبێت کە فایلەکەی ئێستا بەکاریدەهێنین..بەدەستنیشان کردنی سیفەتی action لەم تاقی کردنەوەیەدا.

لەسەرەتادا نموونەیەکی گشتی ئەنجام ئەدەین, ئینجا دوایی بەفراوانی باسی هەر ئۆبگێکتێکیان ئەکەین...سەیری ئەم نموونەیە بکە:

```
<form action="echo.pl">
First Name :
<input type="text" name="first_name"><br>
Secound Name :
<input type="text" name="secound_name"><br>
<input
type="radio" name="exact"> Exact Match
<input
type="radio" name="all"> All Words<br>
```

```
<input
      type="hidden" name="todo" value="search">

<input type="submit" value="Search">

</form>
```




وابزانم زۆر روونە لە نموونەی سەرەوەدا ...چۆن زانیاریەکان لە وێب ئەگوازرێنەوە بەهۆی رێگای get, ئەگەر هەمان تاقی کردنەوەبکەیت بەرێگای post هەمان دەرئەنجامت بۆ دەردەکەوێت...چونکە بەرنامەی echo.pl لەگەڵ هەردوو رێگادا کاردەکات.

## چوارگۆشەی نووسین

چوارگۆشەی نووسین دروست دەکەین هەروەکو لەسەرەوە ووتمان, بەهۆی تاگی input لەگەڵ گۆرینی سیفەتی type بۆ نرخی text, دەتوانیت هەر نرخێك بێت بۆی دابنێیت بەهۆی سیفەتی value, هەروەها ئەتوانیت دەستکاری قەبارەکەی بکەین بەهۆی سیفەتی size, بۆ دەستنیشان کردنی درێژی چوارگۆشەکە.

```
<form action="echo.pl" method="get">
Username <input
      type="text" size="20" name="username"><br>
```

```
Email <input
        type="text" size="40" name="email"><br>
 URL <input type="text"
       size="40" name="url" value="http://"><br>

                <input type="submit">

                       </form>
```




## چوارگۆشەی هەلبژاردن

کە لەنێوان تاگەکانی input بەهۆی دیاریکردنی سیفەتی type بۆ نرخی checkbox , هەروەها ئەو زانیاریانە ئەنێرێن بەرێگای ناو بەسیفەتی name وەنرخ بەسیفەتی value, واتە ئەتوانیت وابکەین فۆرمەکە زانیاری do=subscribe بنێریت ئەگەر بەکارهێنەرەکە یەك لە هەلبژاردەکانی دەستنیشان کرد, بەهۆی دیاری کردنی سیفەتی name لەنرخی do وەسیفەتی value بۆ نرخی subscribe بەبێ هەرلبژاردنی هیچ خیارێك هیچ زانیاریەك نانێرێت.

واتە وەکو جۆری hidden بەکارهێنەرەکە دیاریدەکات کە زانیاریەکە بنێریت یان نا.

```
<form action="echo.pl" method="get">
<input type="checkbox"
    name="do" value="subscribe"> Subscribe.<br>
```

```
<input type="submit">

</form>
```




## هەلبژاردن لەنێوان کۆمەلێک هەلبژاردە

دەتوانیت بازنەی هەلبژاردن دروستکەیت بەهۆی تاگی input کە سیفەتی type نرخی radio بۆ دائەنرێت, بۆ دروست کردنی کۆمەلێك تاگ بۆئەوەی بەکارهێنەرەکە یەکێکیان هەلبژێرێت...پێویستە تاگی input بۆهەریەکەیان بکەیت, ئینجا نرخی سیفەتی nameی هەموویان یەکسان بکە, بەگۆرینی نرخی سیفەتی value بۆ هەریەکەیان.

```
<form action="echo.pl" action="get">

Age : <br>
<input
type="radio" name="age" value="17"> 10 - 17<br>
<input
type="radio" name="age" value="50"> 18 - 50<br>
<input
type="radio" name="age" value="100"> 51 - 100<br>

Gender : <br>
<input
type="radio" name="gender" value="male"> Male
```

```
<input type="radio"
       name="gender" value="female"> Female<br>

<input type="submit">

</form>
```




تێبینی دەکەیت لە نموونەی سەرەوە کە دەتوانیت تەنها یەك هەلبژاردە هەلبژێریت, یان Male یان Female لەلیستی دووەم, چونکە هەمان ناویان name هەیە.

## لیست

کاتی دروستکردنی لیستەکان, پێویستە یەکەمجار تاگی لیست select دابنێیت, ئینجا سیفەتی nameی بۆدیاری دەکەیت, ئینجا دواتر کۆمەلێك تاگی option بۆ دائەنێیت بۆ هەر سیفەتێکی value, کاتی ناردنی زانیاریەکان زانیاریەکە ئەنێردرێت کە ناوەکەی هەیە لەسیفەتی name لەتاگی select نرخەکەشی لەسیفەتی value لەتاگی option کە تۆ بۆت هەلبژارد.

```
<form action="echo.pl" method="get">

<select name="country">
<option value="kr">Kurdistan
```

```
<option value="su">Sweden
<option value="gr">Germany
<option value="ua">Emirates
<option value="uk">England
<option value="fr">France
<option value="irq">Iraq
</select>
<input type="submit">
</form>
```




## چوارگۆشەی نووسینی چەند رستەیەك

ناودەنرێت بە Textarea, بریتیە لەتاگی textarea جووتەك....(کردنەوەو داخستن).. لەنێوانیان نووسینەکە دەبێت, ئەمە زۆرکات بەکاردێت لەگەل فۆرمی زانیاری ناردن بەرێگای post چونکە بۆ ناردنی زانیاریەکی زۆر بەکاردێت.

دەتوانیت کۆنترۆلی ژمارەی رستەکان بکەیت بەهۆی سیفەتی rows وەژمارەی پیتەکان لەرستەی تایبەت بە cols(ژمارەی کۆلۆمەکان).

```
<form action="echo.pl" method="get">

<textarea name="message" rows="6" cols="50">

This Text will appear inside the box !

     WOW

It's working :)

</textarea><br>

<input type="submit">

</form>
```



# پاشکۆ

## تاگی meta

هەرچەندە ناوی تاگی metaیە بەلام لەیەك تاگ پێك هاتووە ئەویش تاگی meta!

تاگی meta بەکاردێت بۆ بەخشینی زانیاری زۆر دەربارەی لاپەرەکەت, وەکو وەصف کردنی لاپەرەکەت, کلیلەکانی مالپەرەکەت, ناوی دانەری مالپەرەکەو ناوی بەرنامەی بەکارهاتوو بۆدروست کردنی مالپەرەکە....هتد, تاگی meta لەفایلی HTML لەنێوان تاگی head دائەنرێت ....چونکە بەشێك نیە لە ناوەرۆکی مالپەرەکە.

لاپەرەکانی meta لەیەك جیان بەهۆی جیاوازی سیفەتەکان name, http-equiv هەندێك بەرنامە جۆری تاگەکە دیاردەکات بەهۆی سیفەتی name هەندێکی تر بەهۆی سیفەتی http-equiv بۆیە واباشە هەردووکیان دابنێیت.

سیفەتی دووەم بۆ تاگی meta سیفەتی content کە ناوەرۆکی زانیاریەکانی هەردوو سیفەتەکەی name, http-equiv دیار دەکات.

کلیلەکان بۆنموونە ناوی keyword, بۆ نموونە ئەگەر کلیلەکانی گەرانی سایتەکەت بەم شێوەیە بێت(هاکەر, زمانەکانی کۆمپیوتەر, وێنەکان, زانست) پێویستیت بەم تاگەی خوارەوە دەبێت:

```
<meta name="keywords" http-equiv="keywords"
content="هاکەر, زمانەکانی کۆمپیوتەر, وێنەکان, زانست">
```

سەیری تاگی سەرەوە بکە بۆشایی کلیلەکان لەیەك جیا ئەکاتەوە.

لەرێگای سەرەوە دەسنیشانی زانیاریەکانی لاپەرەکە دەکرێت بەهەمان رێگا, وە هەمان سیفەتیش وەردەگرێت..name, http-equiv یەك لەم نرخانەی خوارەوەیە:

*keywords: بۆ دیاریکردنی ووشە کراوەکان بۆ فایلەکە ...بەلام نابێت دووبارەی تێدا بێت.

*description: بۆ دانانی وەصفێکی بچووك دەربارەی لاپەرەکە ...واچاکە لە 20 ووشە رەت نەدات.

*generator: ناوی بەرنامەکەی دیزاینی لاپەرەکەی پێ کراوە.

*author: ناوی دانەری لاپەرەکە.

*content-type: بۆدیاری کردنی شێوەی ناوەرۆکی لاپەرەکە.

*copyright: زانیاری لەسەر مافی پاراستنی لاپەرەکەت(مالپەرەکەت).

بۆ گۆرینی ئاراستەی لاپەرەکەت لەراستەوە بۆ چەپ (بەپێچەوانەشەوە). بەهۆی تاگی p دەبێت لەگەل سیفەتی align نرخی right, left بۆ دابنێیت .....بەلام رێگای دووەم بۆ ئەم کارە بەهۆی سیفەتی dir لەتاگی html ئینجا نرخی rtl دابنێیت, ئەمە وادەکات لاپەرەکە لەلای راست بۆ چەپ بێت ...واتە پاراگرافەکان لە راستەوە بۆ چەپەوە دەبن, یەکەم خانە لە جەدوەلەکە لە لای راست دەبێت.

```
<html dir="rtl">
```

# باکگراوندی HTML

ئێستا تۆ فەرمانە سەرەکیەکانی زمانی HTML فێربوویت, بەلام نالێین تۆ تەواو بوویت لەفێربوونی ئەم زمانە یان بوویتە Web Developing, چونکە هێشتا زۆر شتی گرنگ لەرێگاتا ماوە فێرببیت...تا دەگەیتە لیڤلی شارەزا, ئەم زانستەی وێب رۆژ لەدوای رۆژ لەپێشکەوتندایە بۆیە گەیشتن بەم هەموو پێشکەوتنە کارێکی مستحیلە بۆ تازە پێگەیشتوان, بەلام بۆ بەهێزانی ئەم جیهانە ...بە سووربوونیان لەسەر فێربوونی زیاتر ئێستا بوونەتە قدوەی ئەم پێشانگایە.

# Casscading Style Sheet....لاپەڕەی دوایەکی ڕێکخراوە.

CSS بریتیە لە تەکنەلۆژیایەکی پێشکەوتوو بەکاردێت بۆ کۆنترۆلکردنی چۆنیەتی دەرکەوتنی تاگەکان لەمالپەڕەکە, بۆ نموونە ئەدرێسی سەرەکی H1 بەرەنگی ڕەش و فۆنتێکی سادە دەردەکەوێت

بۆ گۆڕینی پێویستت بە دانانی تاگی Font دەبوو لەناو تاگی H1, باشە چۆنە ئەگەر ئێمە خۆمان دیارمان کرد چۆنیەتی دەرکەوتنی ئەدرێسی سەرەکی, وە چۆن پێویستە جەدوەلەکان دەرکەون, وەچۆن تاگەکان دەرکەون, ئەمانە هەموو ئێستا ئەتوانیت ئەنجامی بدەیت بەهۆی تەکنەلۆژیای CSS, ئەم تەکنەلۆژیایە بەردەوام لە پێشکەوتندایە تا گەیشتە ڤێرژنی دووەم ...دەتوانیت لەم لینکە وەریگریت:

/http://www.w3.org/Style/CSS

## زمانی هێماکراوی ئامادە بۆ فراوانبوون

زمانی eXtensible Markup Language یان XML بریتیە لە تەکنەلۆژیایەکی تازە, کە بەهۆیەوە لەم تاگە ستاندەرانە ڕزگارت ئەبێت, بەلکو هەریەکەمان دەبینە خاوەن تاگی تایبەت بەخۆمان, بۆنموونە تاگی h6 کە زۆر کەم بەکاردێت دەتوانیت وای لیٚ بکەیت بۆ مەبەستی ڕەنگ یان سیفەتێکی تر بەکاریبهێنیت, یان وەك ستایلێك بەکاریبهێنیت, وەکو دەرکەوتنی نووسینێك بە فۆنتێك و ڕەنگی سوورو تەنسیقێکی دیاریکراو....بەم شێوەیە تاگی h6 ئێستا سیفەتی پێشەوەی نابێت.

بۆیە بیرۆکەی زمانی هێماکراوی ئامادە بۆ فراوانبوون هاتە کایەوە, واتە بۆخۆت تاگێك دروست دەکەیت و ناوێکی بۆ دادەنێیت و سیفەتێکی دیاری کراویشی ئەدەیتیٚ و وە چۆنیەتی دەرکەوتنیشی بۆدیاریئەکەیت .....بۆ زیاتر زانیاری برۆ بۆ بەشی تایبەت بە XML:

/http://www.w3.org/XML

## زمانی جاڤا سکریپت

زمانی جاڤا سکریپت بریتیه لەزمانێکی پرۆگرامی دیاری کراو, تایبەته بۆ کارکردن لەگەل مالپەرەکانی وێب... بۆ دەستکەوتنی مالپەری دینامیکی, بۆنموونه ئەتوانیت دووگمەیەك دروست بکەیت کارێکی تایبەتت بۆ بکات لەسەر کۆمپیوتەری ئەو کەسەی کەسەی لەسەرکردوه بیٚ ناردنی زانیاری بۆ سێرڤەری وێب, ئەم زانسته زۆر بەکاردێت لەمالپەرەکانی کەسیەوه بۆ دروستکردنی جوولەو ئیفێکت, بەم دواییه چەندین سایت دەرکەوتن کە سکریپتی ئامادەکراو پێشکەش ئەکات, زۆر بەئاسانی دەتوانیت لەمالپەرەکەت زیادی بکەیت....بۆ زیاتر زانیاری سەردانی ئەم سایتانه بکە:

/http://javascript.internet.com یان سایتی /http://www.dynamicdrive.com.